

تصوير ابو عبدالرحمن الكردي
دارستانەکە
٢
کۆمەڵە چیرۆکێکی منداڵان
نوا
بەتریقە ئەمینەکە
داناني: واریسی ئەلکندی
وەرگێڕانی: پەریان ئەحمەد زەردەشت
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور







# بەتریقە ئەمینەکە



ناوی کتێب: نوا بەتریقە ئەمینەکە
دانانی: واریسی ئەلکندی
وەرگێڕانی: پەریان ئەحمەد زەردەشت
هەڵەچن: ڕەووف مەلایی
بلاوکراوەی: بوراق بۆ چاپ و بلاوکردنەوە
دیزاین و جێبەجێکردن: کومپانیای نوور
نیگار: فیردۆس مونعیم
ڕەنگی ژمارەیی: مەلیحە حەسەن
سەرپەرشتی هونەریی: محەمەد ئەلقاسمی
تیراژ: ٥٠٠٠ دانە
ISBN: ٩٧٨-٩٦٤-١٩٢-٢٤٣-٥
چاپی یەکەم ٢٠١١








شەمیم سنە


ژمارەی سپاردن بە دەزگای کتێب و بەڵگەنامەکان- بەغدا (١٤١٤) ساڵی ٢٠٠٩
Web site: www.alburagh.com E-mail: Info@alburagh.com




نوا بەتریقێکی ژیرو دەست پاک بوو. ماڵەکەی دەیروانییە سەر ڕۆخی بەردەڵانی دەریاکە. ئەو
ڕۆژە چووە دەرێ، چاوی بە هەرسێ هاوڕێکەی کەوت. ئەوان لە گەشتێکی ڕاوی دەریایی
گەڕابوونەوە. سڵاو و پێشوازی لێکردن و داوای میوانداریێتی کردن. سوپاسیان کرد و وتیان،
دەمانەوێ جارێکی‌تر بگەڕێینەوە بۆ ڕاوە ماسی، بەڵام کەشتێکەمان پڕە لە ماسی و ئیتر لەوە
زیاتر ناگرێ، تکامان ئەم توورەکە ماسییەت پێدەسپێرین تا دەگەڕێینەوە... نوای ڕۆح سووک
وتی: بەوپەڕی خۆشییەوە. ئەڵبەتە تا دەگەڕێنەوە ئەمانەکەتان پارێزراوە.



له سووچێکی نێوان تاشه بەردەکانەوە، سەگە ئاوییەکە ئاگای لەم کەین‌وبەینە بوو، برادەرەکان خواحافیزییان کرد و نواش گەڕایەوە ماڵێ و چاوی بڕییە توورەکە ماسییەکە و لەبەر خۆیەوە وتی: دەبێ ئەم ئەمانەتە بپارێزم تا هاوڕێکانم دەگەڕێنەوە و دەیبەنەوە.
بەم جۆرە بە درێژایی ڕۆژ تا ئێوارە لە ماڵەوە جێگیر بوو، سەگە ئاوییەکە لە پەنجەرەکەوە سەیری (نوای) دەکردو دەمی ئاوی کردبوو. لەبەر خۆیەوە دەیگوت: شازی ڕاوە، چەورە..!! من برسیمە. لە بوارێکی شیاودا هەر دەبێ بیگۆزمەوە..!



بەیانی زوو نوا دەسپاک هەڵسا و لەبەر دەرگا وەستا. وەک هەموو ڕۆژێک دەیڕوانییە دەریاکە، هەندێ پەڵە هەوری چڵکن بەرەو ئەو ڕۆخە دێت، وتی: زریانێکی بەفرین بەرەو ڕۆخەکەمان دێت، هەر بۆیە دەبێ هەمووان ئاگاداربن و ڕوو بکەنە کون و ئەشکەوتەکان، ئەگینا خاپوور دەبن و ژیانیان لێ زەوت دەکرێ.. نوای دڵسۆز بە هەموو ئاژەڵ و باڵندەکانی ڕاگەیان، کە زریانێکی بەفرین بە ڕێگاوەیە، ئەوە بوو هەمووان خۆیان گەیاندە ئەشکەوتەکان، بەڵام نوای خەمخۆری هەمووان، مایەوە تا ئەم هەواڵە بە هەندێکی‌تر ڕابگەینێ. سەگە دەریاییەکە، بواری بۆ لوا.



ئەگەر چی (نوا) هیلاک و ماندوو بوو. بەڵام شادومان بوو چونکە ئەرکی یاریدەدانی هاونیشتمانیانی گرتۆتە ئەستۆ. پێش ئەوەی بچێتەماڵەوە پشوویەک بدات، لە دوورەوە کەشتیێکەی بەدیکرد. شەپۆلەکان بەرەو ڕۆخەکە دەهاویشتن، هەر خێرا ڕووەو ئەوێ بووەوە. کە دی هەرسێ هاوڕییەکەی لاڵوپاڵ بەسەر زەوییەکەوە کەوتوون، هەربۆیە یەکە یەکە بەرەو ماڵەوە ڕایکێشان. سەگە دەریاییەکە ئەمەی بەهەل زانی و چووە ماڵی و تورەکەکەی فڕاند و بە و پەڕی خۆشییەوە تورەکەکەی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا و لە بەینی تاشە بەردەکاندا شاردییەوە.



سەگەکە توورەکەکەی کردەوە کە دی پڕە لە ماسی و گوێچکە شەیتانۆکە و قرژاڵی دەریایی، هەروەها مرواریییەکی گەورەی بەنرخیشی تیا بوو.. دایە قاقای پێکەنین و دەستی کرد بە ماسی خواردن و مرواریییەکەی لە چاڵێکی بچووکدا شاردەوە و لەبەر خۆیەوە وتی: پاش ساتێک بە بەفر دادەپۆشرێ و لە من زیاتر کەس شوێنەکەی نازانێ .. ها.. ها ..ها ... پاش هێور بوونەوەی زریانەکە بە نرخێکی بەرز دەیفرۆشم و بە ئارەزووی خۆم پارە سەرف دەکەم، کەشتی دەکڕم، ئاژەڵ و باڵندە بە کارەکەر ڕادەگرم و کاریان پێ دەکەم و دەبمە پادشایان، ئەم ماسیەش چەند ڕۆژێک بەشم دەکات، ئینجا پاڵکەوت و سکی پڕ بوو لە ماڵی حەرام و ڕەنجی شانی کەسانیتر



بـەڵام نوای دڵسـۆز. لەماڵەوە ئاگری کـردەوە و هاوڕێکانی گەرم کردەوە و خۆراکی بۆ ئامادەکردن. لە پڕێکا بیری کەوتەوە و وتی: ئەرێ ئەمڕۆ سـەگە دەریاییەکەم نەدی... پاش گەڕانێکی زۆر سـەیری کرد لە نێوان بەردەکاندا نووسـتووە. ویسـتی هەڵیسـێنێ و بیباتەوە ناو ئەشـکەوتەکە. سـەیری کرد توورەکەکەی بە تەنیشتەوەیە و بەرە بەرە بەفر دایدەپۆشێ و مرواربیەکە لە چاڵەکەدایە.... ئەوەی لا سەیر بوو. هەر زوو گەڕایەوە ماڵێ ئەمانەتەکەی نەدۆزییەوە.. ئەم تاوانەی شـاردەوە و بە کەسی نەگوت. زریانەکە بەردەوام بوو بە درێژایـی ئەو ڕۆژە شـەپۆلی دەریاکە بەرز دەبـۆوە. بەرە بەرەش بەفر هەموو شـتێکی دادەپۆشی..


له ڕۆژی ئایندەدا زریانەکە گیرسایەوە و شەپۆلەکان
هێمن بوونەوە و ئاژەڵەکان لە ئەشکەوتەکانەوە
دەرپەڕینەوە و باڵندەکان لە لووتکەی چیاکانەوە
هاتنەوە خواری و سوپاسی (نوا)ی خەمخۆری
هەموانیان کرد. کە یارمەتیی دان، هەرسێ هاوڕییەکە
کە ویستیان بچنەوە ماڵی خۆیان، نوا پێی گوتن، بچن
کەشتییەکەتان چاک کەنەوە و منیش دەچم بۆ شوێنێک
و دەگەڕێمەوەو ئەمانەتەکەتان دەدەمەوە.


نوا چووە لای شێرە دەریاییەکە کە گەورەی ئاژەڵانی ئەو ڕۆخە بوو. کردارەکەی سەگە دەریاییەکەی بۆ گێڕایەوە. شێرە پێیگوت: بێخەم بە ئێمە یارمەتیت دەدەین، ئەو توورەکەیەت دەست دەکەوێتەوە و سەربازەکانم دەنێرم دەستگیری بکەن..
سەربازەکانی لەگەڵ نوادا نارد. چونە شوێنی سەگە دەریاییەکە سەیریان کرد نووستووە. دوو سەرباز هەوڵیاندا دەستی ببەستنەوە. بە ترسەوە هەڵسا و ویستی ڕا بکات، بەڵام نوا و دوو سەربازەکە گرتیان، هاواری کرد من هیچم نەکردووە، چیتان دەوێت؟


پادشا وتی: ئەی سەگ، تۆ توورەکە ماسییەکەت لە ماڵی نوا دزیوە... وا نییە؟ وەڵامی دایەوە
و لە ترسا قسەی پێ نەدەکرا بەڵام هەستی کرد کە ناتوانێ ڕاستی بشارێتەوە، وتی: بەڵێ
گەورەم چونکە برسیم بوو، بەهۆی کەش و هەوای سەختیشەوە نەمتوانی مەلە بکەم و ماسی
بگرم، هەر بۆیە توورەکەکەم دزی چونکە خۆراکێکی ئامادە بوو..
شێرە وتی: باشە دەبێ هەر ئێستا توورەکەکە بگەڕێنیتەوە بۆ خاوەنەکەی یاخود زۆر بە توندی سزات دەدەم.



سەگە ئاوییەکە. توورەکەکەی لە ژێر بەفرەکەوە دەرکرد و تەنانەت مرواریيەکەشی دایەوە..
نوا سوپاسی شێرەی کرد و وتی: دەبێ پەلە بکەم ئەم ئەمانەتە بگەێنمەوە خاوەنەکانی، خواحافیزی کرد
و توورەکەکەی دا بە شانیا و خێرا بەرەو ماڵ بووەوە. هاوڕێکانی پێشوازییان لێکرد و وتیان: زۆر
دواکەوتی، ئێمە دەمانەوێ بچینەوە ماڵێ.. ئەمیش وتی.. دەباشە ئەوە ئەمانەتەکەتانە ببەن، بەڵام گوێ
لەم چیرۆکە بگرن. ئەڵبەتە سەرگوزشتەی توورەکەکەی بۆ گێرانەوە.. سەریان لە ئەمانەتی و
دەستپاکی نوا سوڕما و سوپاسیان کرد و مرواریيە گرانەکەیان بە دیاری پێبەخشی..




پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ

**" ئەمانەت بدەرەوە بەو کەسەی باوەڕی پێکردیت و خیانەت مەکە لەوانەی موتمانەت پێدەکەن"**

### هاوڕێیانی ئازیز

لەم چیرۆکەدا وانەیەکی ئەمانەت فێر دەبین، چونکە دەبــێ ئەمانەتــی کەســانیتر بــە هــەر نرخێــک بێــت بیپارێزین و بیگەڕێنینەوە بۆ خاوەنەکانی. جا گەر وا نەبێ ئەوە کارێکە خوا پەسەندی ناکات. تەنانــەت خەڵکیش ئەو کەســەیان خــۆش ناوێ، وەک پێغەمبــەر دەفەرموێ. لەم چیرۆکەدا دیتان چۆن (نوا) توورەکەکەی پاراست و کە دزراش نا ئومێد نەبوو و هەوڵــی دا و دۆزییەوە. بەڵــێ هاوڕێیانم ڕاتان چییە گەر بەرەنگاری هەمان هەڵوێست بوون؟ چی دەکەن؟

















